زنجیرەی گەنجانی ئیسلام 40

# بۆچی دەسەڵات و حکومەتە عەلمانیەکان دژایەتیمان دەکەن

نوسینی: شێخ محمد تونسی




KTEBXANAY TWESHW

ئەمە پەیام و ئاگادارکردنەوەی منە بۆ ئێوە بیزانن ڕۆژی زیندووبونەوەش کات و شوێنی بەیەك گەیشتنەوەمانە لەلای خاوەن عەرشیشدا خەڵك دەزانێ چ باشە.!

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نصْرُ الْمُؤْمِنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

وا بەستەبوونی هەر موسڵمانێك بەهەر بیر و بۆچونێك كە بیەوێ وادەكات كە ئاین وەك بابەتێكی ناوەندی و شتێكی ناوەنجی لێبێت، كە ئەمەش بیروكەیەكی بێ باوەڕان و هاوبەش پەیداكەرانە لە هەمان كاتدا وەك بیروبۆچونی بەعسیەت و بیروبۆچونی شیوعیەت و عیلمانیەت و نەتەوەپەرستی و هی تریش ..

بەراستی ئەمەش هاوبەش پەیداکردنە لە گوێڕایەڵی کردن و دادوەری بردنە ژێر پەیڕەوێك جگە لە پەیڕەو و بەرنامەی خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بێگومان یەکەم شتێک کە خوای گەورە فەرز و پێویستی کردوە لەسەر بەندەکانی پێش نوێژ و زەکات و ڕۆژوو، هەروەها پێش حەج کردنیش بریتیە لە یەکخواپەرستی کە ئەویش بەتەنها گرتنی خوای گەورەیە لە پەرستنیدا بەڵێ پەرستنی خوای گەورە بەتەنها و بێ هیچ هاوەڵێک: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)الذاريات٥٦.

واتە: بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردوە تەنها بۆ ئەوە نەبێت من بپەرستن و فەرمان بەردارم بن.

ڕاقەوانان دەفەرموون: واتە بمپەرستن و یاخود بۆ ئەوەی بەتاک و تەنها ڕامگرن لە پەرستندا.

وە لە پێناو پەرستنی خودا بەتاک و تەنهایی و بێ دانانی هیچ هاوەڵێک بۆی خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردوە و پەیامەکانی دابەزاندوە:

(وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ) (النحل ٣٦)

واتە: سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردوە پێیان ڕاگەیاندوە کە پێیان بڵێت تەنها خوا بپەرستن خۆتان دوربگرن لە هەمو پەرستراوێکی تر.

ئەوەش هۆکاری سەرەکی و ڕاستەقینەبوو بۆ ئەو دژایەتی و ناکۆکیەی نێوان پێغەمبەران و گەلانیان خوای گەورە دەفەرموێت:

(وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ)النمل٤٥.

واتە: سوێند بەخوا بۆ هۆزی ثمود یش صالحی برایانمان نارد فەرمانمان پێدا کە پێیان بڵێ تەنها خودا بپەرستن کەچی دەستبەجێ خەڵکەکە بوون بە دوو دەستەوە و کێشەو ناخۆشی لەنێوانیاندا بەرپابوو.

لێرە فەرمایشتی خودا (اعْبُدُوا اللَّهَ) واتە: بەتەنها خودا بپەرستن و جگە لەو کرداری پەرستش بۆ کەسی تر ئەنجام مەدەن چونکە پەرستن مافێکی تایبەتی خودایە.

بێگومان ئەوەی هەموو پێغەمبەران نەتەوەی هەموو خەڵکانی تر باوەڕیان هەبوو بە خودا بەڵام خودای تریشیان لەگەڵدا دەپەرست!!!! هەرلەبەر ئەوەبوو کە پێغەمبەران هاتن تا بانگەوازی خەڵک بکەن بۆ بەتاک و تەنها پەرستنی خوای گەورە لە پەرستندا و هاوبەش دانەنان بۆی لە پەرستنیدا بەڵگەش فەرمایشتی خودایە کە دەفەرمووێ:
(...أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ...)

## الطاغوت:

پرسیار: طاغوت چییە و بەکێ دەوترێ؟

وەڵام: طاغوت هەرشتێکە کە جگە لە خودا بپەرسترێ و پێی ڕازی بێت...

وە شێوەکانی طاغوتیش جۆراو جۆرە و دەگۆڕێ لە هەموو کات و شوێنێکدا، جا هەندێ جار طاغوت بریتی دەبێ لە بتێک کە خەڵکی کڕنوشی بۆ دەبەن، یاخود قوربانی بۆ دەکەن، یاخود نەزری بۆ دەکەن، جاری واش هەیە طاغوت خۆی لە حیزب و پارتێکدا دەبینێتەوە کە بەوەی گوێڕایەڵی دەکرێ لە فەرمانەکانی بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئایا ئەم فەرمانە لە ڕەزامەندی خودایە یان لە تورەکردنی، یاخود هەندێ جار خۆی لە ئەنجومەنێکدا دەبینێتەوە جا لەژێر هەر ناوێکدابێت، شت قەدەغە (حرام) بکات یان ڕێی پێ بدات (حەڵاڵ) بکات، یاخود (حەڵاڵ) حەرام بکات لەجیاتی خودا، وە هەندێ جار طاغوت کەسێکە سەرۆک بێت یان ئەندامی پەرلەمان یان جادووگەر یان هەرشتێکی تر کە فەرمان بکات و قەدەغە بکات یاسا دابڕێژێ لەوەی خودا ڕێگەی پێ نەداوە.

## ڕوونکردنەوەی گومانێک:

ڕەنگە کەسێک پرسیار بکات و بڵێ بۆچی لە پێناسەی طاغوتدا دەڵێن: (وهو راضٍ) واتە:پێی ڕازی بێ لە کاتێکدا بت شتێکی بێ گیانە و قسەناکات کەواتە چۆن ڕازی دەبێت، چۆنیش ڕازی نییە؟

وەڵام: ئێمە کە پێی ڕازی بونی بەمەرج دادەنێین لەبەر ئەوەیە کەوا زۆربەی جار و بەگشتی وا دەبێت کە طاغوت پیاوێکی چاک بووە و ئەو گەلەی لەدوای نەمانی وەکو خوایەک سەیریان کردوە یان جۆرێک لە جۆرەکانی پەرستنیان بۆ ئەنجام داوە.

## جا ئایا ئەم پیاوچاکە دەبێتە طاغوت:

بێگومان نەخێر چونکە ئەو بەم پەرستنە ڕازی نەبووە، وە کاتێک کە گۆڕەکەی کراوە بە شوێنێک بۆ هاوبەش پەیداکردن بۆ خودا بەوەی خەڵکی دەچنە سەر گۆڕەکەی و داوای خێر و پێداویستی خۆیان (بەهەموو جۆرەکانی) لێ دەکەن یاخود داوای لێ دەکەن کە زەرەرو خراپە بە (بە هەموو جۆرەکانی) لەسەریان لابدات وەکو گۆڕی پێشەوا علی و حسین (خوای گەورە لێیان ڕازی بێ)...

بەڵکو تەنانەت پێغەمبەرانیش، ئەوەتا عیسی (علیه الصلاة والسلام) دەپەرسترێ بەڵکو کراوەتە خودا جا ئایا دروستە بڵێین طاغوتە؟!

ئەگەر وا بڵێین بێگومان بێ باوەڕ دەبین (پەنا بەخوا) چونکە عیسی (علیه الصلاة والسلام) بانگەوازی گەلەکەی دەکرد بۆ تەوحید و پەرستنی خودای تاک و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن، بەڵام ئەوان لەم پەیامە ڕاستەقینەیە لایاندا، هەر لەدوای بەرزبونەوەی بۆ ئاسمان دەستیان کرد بە پەرستنی!!
کەواتە ئەوەی دەیبینی لە پەرستنی بتەکان وەکو (لات و مەنات و عوزا) هەموویان پێشتر پیاوی چاک بوونە، دوای مردنیان بەچەند ساڵێک وێنەیان دروست کراوە، پاشان بۆ ئەم وێنانە پەیکەریان تاشیوە، پاشان بە تێپەڕینی کات نەوە و نەتەوەیەک هاتوون و سوژدەیان بۆ بردوون و بەخوایان زانیون لەشێوەی بتدا لەبەرئەوە هەرکەسێک ئەم کارە بکات دەبێتە هاوەڵ دانەر بۆ خودا وەئەگەر ئەم پەرستراوەش پێی ڕازی بێ ئەوا دەبێتە طاغوت.

بەڵام گەر پێی ڕازی نەبوو ئەوا بەرییە لەو کەسانەی پەرستویانە بەهەر جۆرێک لە جۆرەکانی پەرستن بە کڕنوش یان بە لێ پاڕانەوە یان هەرشتێکی تر...

(إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ فَادْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ) الاعراف١٩٤.واتە: بەڕاستی ئەوانەی ئێوە هاواریان لێدەکەن جگە لە خوا و لێیان دەپاڕێنەوە،چەند بەندەیەکی وەک ئێوەن(هیچیان بەدەست نییە)دە هاواریان لێ بکەن بابێن بە دەمتانەوە ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن.

ئینجا هەر لەپێناو بانگەواز بۆ خودای تەنها و پەرستنی و هاوەڵ نۆ دانەنانی بێ باوەڕبوون بە طاغوت بە هەموو جۆرەکانی، پێغەمبەران ئازار دراون و ئەشکەنجەدراون و زیندانی کراون یاخود هەڕەشەیان لێکراوە بە زیندانی کردن هەروەکو فیرعەونی مصر هەڕەشەی زیندانی کردنی کرد لە پێغەمبەر موسی(علیه الصلاة والسلام).

(قَالَ لَئِنِ اتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِي لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ الْمَسْجُونِينَ)الشعراء٢٩.
واتە: فیرعەون سوێندی خواردوو گوتی ئەگەر جگە لەمن کەسێکی تر بکەیتەوە خوای خۆت و فەرمان بەرداری بیت دەتخەمە ڕیزی بەندکراوەکانەوە و زیندانیت دەکەم.

لێرەدا دەبینی کە فیرعەون داوا لە موسا دەکات بیکاتە خودای خۆی ئەگەرنا دەیخاتە زیندان !!
هەر بەم شێوەیە هەموو طاغوتێک داوا لە خەڵکی دەکات کە ملکەچی بن و گوێڕایەڵی بکەن با سەرپێچی فەرمانی خوداشی کردبێ و لە گوێڕایەڵی دەرچووبێ.

وە زۆر پێویستیشە کە هەموو کەسێک بزانێ کە بێ باوەڕی و بێ بەری بوون لە طاغوت مەرجە بۆ باوەڕبوون بە خودای گەورە، هەر وەکو دەست نوێژگرتن مەرجە بۆ ئەنجام دانی نوێژ، وە نوێژ بەتاڵە و وەرناگیرێ بەبێ دەست نوێژ گەر مسوڵمان ئەنجامیشی بدات، بەهەمان شێوە باوەڕ هەبوون بە خودای تاک و تەنها تەواو نابێ و

وەرناگیرێ بەبێ بێ باوەڕی و بێ بەری بوون لە طاغوت بەبەڵگەی خودا کە دەفەرمووێ: (فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ)البقره٢٥٦.

واتە: هەرکەسێک کوفر بە طاغوت بکات و باوەڕی دامەزراوو بهێنێت بە خودا بێگومان ئەو کەسە دەستی گرتوە بەبەهێزترین هۆکاری ڕزگاریەوە وە شوێنی دامەزراوترتن بیروباوەڕ کەوتووە.

وە ڕەنگە زۆرترتن جۆری طاغوت کە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدان وە بڵاوە بریتی بێ لە ڕێگەپێدان و قەدەغەکردن (حەڵاڵ کردن و حەرام کردن) ئەویش بەدەرکردن و دارِشتنی یاسا و بڕیارەکان پاش سەپاندنی بەسەر مسوڵمانەکان، وە پارێزگاریکردن لە جێبە جێ کردنی ئەم بڕیار و یاسانە بە سوپا و پۆلیس دەزگاکانی ئاسایش و هەواڵگری یان بەهۆی چەک و زۆری سەرباز، جا هەر باوەڕدارێک بەرهەڵستی بکات بە ڕوی ئەم یاسا و ڕێسا و دوژمنکارانەی کە دژە بە ئیسلام و پێچەوانەی کاری خودایە، خێرا تۆمەت باردەکرێت بە دەرچوون لە یاسا و توندڕەو و تیرۆرست یان بە هاندەری توندوتیژی.

پاشان پاشان ڕاپێچی دادگا ستەم کارەکانیان دەکرێت بەمەبەستی بەندکرنی ئەم یەکخواپەرستە بەهیچ تاوانێکیش نا بەڵکو تەنها لەبەرئەوەی داوای پەیڕەوکردنی یاساکانی بەرنامەی ئیسلامی کردووە و یاساکانی عەلمانیەتی ڕەتکردۆتەوە بێ باوەڕ بووە پێیان.

بەشێیوەیەکی ڕونتر بڵێین کە ئەم مسوڵمانە زیندانی ئەکرێ چونکە باوەڕی هەیە بەوەی کە تەنها خودای تەنها مافی ڕێسارێژی و بەرنامە دانانی هەیە وە هەر ئەویش شایستەیە بە گوێڕایەڵی بکرێ وە بێ باوەڕە بەو مرۆڤانەی خۆیان کردووە بە ڕێسارێژ و بڕیاردەر لە شوێنی خوای پەروەردگار، مرۆڤانێک کە کەم و کوڕی و نەزانین و ئارەزوبازی و ستەم ولاسەنگی و دەمارگیریان تێدایە و تووشیان دێت.

لە هەموو ئەوانەدا ئەو جەنگە ڕوون دەبێتەوە کەلەمرۆڤدا لەنێوان سەربازانی خودا و سەربازانی شەیتاندایە، لەنێوان خواپەرستان و هاوبەش پەیداکەران دایە لەنێوان مسوڵمان و هەڵگەڕاوەکاندایە.

لەوەشدا تێدەگەین بۆچی ئەو زاناو بانگخوازانەی خەبات و جیهاد دەکەن لەپێناو خودا بەزمان و بەچەک دەکوژرێ و لەسێدارە دەدرێن ئینجا لەبەرئەوەی ئێمە پەرستن بۆ خودا ئەنجام دەدەین و هاوەڵی بۆ بڕیار نادەین وە لەبەر ئەوەی بەری و بێ باوەڕین بە طاغوت، باوەڕدارین تەنها بە خودا وە لەبەرئەوەی دەسەڵاتدارەکان عەلمانین و هەڵگەڕاوەن لە ئاینی ئیسلام، وە لەبەرئەوەی حیزب و پارتەکانیان و فەرمانڕەوایەتیەکانیان خۆیان خستۆتە شوێنی خوای گەورە و دەیانەوێ خەڵک و گەل ببێتە بەندە بۆیان، لەبەر ئەمە ڕق و دوژمنایەتی لەنێوان ئێمە و ئەواندا دروست بووە:

(قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ من دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ)المتحنه٤.

واتە: ئەی ئیمانداران بەڕاستی لەئیبراهیم و ئەوانەی کەلەگەڵیدابوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو کاتێک کە بەقەومەکەی خۆیانیان وت: دوای ساڵەها بانگەواز ئێمە بەرین،ئێمە بەرین لەئێوە و لەوشتانەش کەلەجیاتی خودا دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەودین و

ئاینەی ئێوە نییە،ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانمان بەرپا بووە تا ئەوکاتەی باوەڕ بە خوای تاک و تەنها دەهێنن،جگە لەو بەڵێنەی دای بەباوکی وتی بێگومان داوای لێخۆشبونت بۆدەکەم، دەسەڵاتی خواشم نییە ئەگەر کارەساتێکت بەسەر بهێنێت.

جا ئەی مسوڵمان: چ سوودی هەیە ئەگەر هەر یەکێک لە ئێمە نوێژ بکات و بەڕۆژوبێت و ماڵ ببەخشێ وە حەج بکات،کەچی بەری و بێ باوەڕ نەبێت بە طاغوت و هەموو پەرستنەکانی بۆ خوا ساغ نەکاتەوە.

جا ئەگەر هاتوو ئەو کەسە نوێژو رۆژوو حەج و ماڵ بەخشینی هەبێ پاشان لە هەمان کاتدا کەسێکی عەلمانی بێ یان ئەندام بێ لە پەڕلەمان دەست بڵند بکات بۆ ڕەزامەندی لەسەر ڕێساو یاسایەکی پێچەوانە بە ئیسلام یان لە حیزب و پارتێکی بەکرێگیراوبێ بۆ ئەمریکا یان ئیسرائیل یان بۆ هەر لایەنێکی تری بێ باوەڕ، یان یارمەتیدەر و پشتیوانی بکات لە داگیرکەر دژی مسوڵمانان یان هەستێ بە دەستگیرکردن و ئازار و ئەشکەنجەدانی کۆشش و کاری موجاهیدان

یان زانیاری بدا لەسەر کاری موجاهیدان یان ناوەکانیان یان هەر زانیاریەکی تر لەسەر هەر مسوڵمانێک، تەنانەت لەسەر ئەو مسوڵمانەشس کەلە ماڵی خۆی دانیشتووە، بچێ ئەم زانیاریانە بدات بە حیزب و پارتێک یان حکومەتێک یان بەکرێگیراوێک یان عەلمانیەک یان کەسێک کە دوژمنایەتی مزگەوتەکان و ئاین بکات و بەدڕەوشتی و بیروباوەڕی گومڕایی و نەریتی داگیرکەران بڵاو بکاتەوە..

ئا ئەم مسوڵمانە هیچ سوودی بۆ نابێت لە نوێژەکانی و وەنە حەج و ڕۆژوەکانی وە نە هیچ شتێکی تر پەرستنەکانی چونکە ئەوەی شایەتومانی پێ بەتاڵ دەبێتەوە ئەنجامی داوە، هەرووکو وتمان وەکو ئەوە وایە کەبێ دەست نوێژ، نوێژ بکات، جا با هەزار ڕکات بکات!!

ئایا لێی وەردەگیرێ؟

بەڕاستی بەری و بێ باوەڕبوون بە طاغوت مەرجە بۆ وەرگیرانی باوەڕ، ئەو کەسەش باوەڕی هێناوە بێ ئەوەی بەری بێ لە طاغوت!! بەڵکو ئەمە یارمەتی و پشتیوانی طاغوتی کردوە لە دژی مسوڵمانان لە دوای شکستی ئەحزاب وە لە هەمان ڕۆژی گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە لەکاتی نیوەڕۆ جبریل (سەلامی خوای لێ بێ) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی فەرموو:بەڕاستی چەکت داناوە بەڕاستی هێشتا مەلائیەکەتەکان هێشتا چەکیان دانەناوە، وە ئێستا منیش نەگەڕاومەتەوە لات تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە بچینە سەر ئەو خەڵکەی کە ناپاکیان لەگەڵ کردی، جا خۆت و ئەوانەی لەگەڵتدان هەستن و بڕۆن بۆلای (بەنی قوڕەیظە)، منیش لەپێش تۆدا دەچم قەڵاکەیان پێوە دەلەرزێنم و ترس دەخەمە دڵیان، ئەوە بوو جبریل بە پۆلێک لە مەلائیکەتەکان بەڕێکەوتن بەمەش پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بە موجاهیدان کە بەرەوە(بەنی قوڕەیظە)بەڕێ بکەون فەرمووی: (من كان سمعاً مطيعاً فلا يصلين العصر الا ببني قريظه) واتە: هەرکەسێ گوێڕایەڵمانە با نوێژی عەسر نەکا لای بەنی قورەیظە نەبێت.

ئینجا لەدوای ئەوەی گەمارۆی خستە سەریان و بەسەریاندا درێژەی خایاند و ویستیان چارەنوسی خۆیان بزانن گەرخۆیان دا بەدەست بۆیە ناردیان بۆلای پێغەمبەر ﷺ داوایان لێکرد (ئەبولوبابە) یان بۆ بنێرێ تاوەکو ڕاوێژی پێ بکەن چونکە ماڵ و منداڵ و سەروەتەکانی (ئەبولوبابە) لە ناوچەی ئەواندا بوو هاوپەیمانیشیان بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕازی بوو و ئەبولوبابەی ناردە لایان، جا کە ئەبولوبابە گەشتەلایان پیاوەکانی بەنی قورەیظە بەرەو پیری چوون و ئافرەت و منالەکانیشیان دەستیان بەگریان کرد بەڕوی ئەبولوبابە، ئەویش لە دڵەوە سۆزو بەزەیی جولا بۆیان،ئینجا پێیان وت: ئەبولوبابە پێت باشە ملکەچی بڕیارت محمد بین؟

ئەبولوبابەش فەرمووی: بەڵێ، وە بەدەستی ئاماژەی کرد بۆ ملی، وەکو ئەوەی پێیان بڵێ:بڕیارەکە سەربڕینتانە، بەڵام هەردەم و دەست زانی کە خیانەتی کرد لە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ چونکە نهێنیەکی مسوڵمانانی درکاند بۆ بێ باوەڕان و جولەکەکانی بەنی قورەیظە..

لەبەر ئەمە بەرەودوا گەڕایەوە و چووە ناو مزگەوت خۆی بەستاوە بە کۆڵەگەیەکی مزگەوت و سوێندی خوارد کەئەبێ تەنها پێغەمبەری خوای ﷺ بەدەستی خۆی بیکاتەوە.

هەروەها سوێندی خوارد کەبەهیچ شێوەیەک نەچێتە ناو خاک و ناوچەکانی بەنی قورەیظە تا کۆتایی چیرۆکەکە ئەم بابەتە وەرگیراوە لە کتێبی (الرحيق المختەم،شێخ صفی الرحمن المبار كفوری،غزوة بني قوريظة)

جائەمە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ کە ئەبولوبابەیە یەکسەر هەستی کرد کە (خیانەتی کردوە لە خوا و پێغەمبەر ﷺ) تەنها بە ئاماژە پێکردنێك بۆ دوژمنانی خوا بەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ چیان لێدەکات...

چ جای کەسێک هەواڵدەری نهێنی بێ وە ڕاپۆرت بنوسێ، یان کەسێک هۆکاربێ بۆتێکدانی خێزانی مسوڵمان، یاهۆکاربێ لە کوشتنی خواپەرستان لە بانگخوازان یان موجاهیدین،یان ببێتە پشتیوان بۆ داگیرکەران(یان ئەفسەرێک بۆ دژایەتیکردن و ڕوبەڕوبونەوەی ئیسلام) لەخزمەت هەڵگەڕاواندابێ

تا کۆتایی ئەو شتانەی ئاشکرایە لەلای هەموو خەڵکی...

جا ئەگەر ئەبولوبابە هاوەڵێکی پێغەمبەر بوە ﷺ ئەوەیە کە ئێمە پێداگیری لێ دەکەین لە بەری بون و بێ باوەڕی بە طاغوت کەئەوەش بەبەری بوون لەپەرستنی طاغوت.

واتە بەری بوون لەسەرخستنی یان خۆشویستنی یان پشتیوانی کردنی یان لایەنگیری کردنی پێشکەش و ئامۆژگاری بۆی یان هاوڕێیەتی کردنی، چونکە بەڕاستی ئەمە بابەتێکە پەیوەندی هەیە بە بیروباوەڕ و یەکخواپەرستی نەک بەبابەتێکی لاوەکی وە ئەو بابەتانەی ناسەرەکین و چەند واتایەکی پێچەوانەی هەیە و پیوەندە بە ناپەسەند و پەسەند.

## موسڵمانان ڕەنگە پرسیار بکەن و بڵێن:

کەسی وا هەیە نوێژ دەکات و حەج دەکات و ماڵ دەبەخشێ و بەڕۆژوو دەبێ و باوەڕیشی بەخودا هەیە جائەمە چۆن دەبێ ببێتە هەڵگەراوە یان بێ باوەڕ:

دەڵێین: لە پێشتردا ئەوەمان زۆر بە ئاشکرایی ڕوون کردەوە،باوەڕ هەبوون بە خواد وە نوێژ کردن و ڕۆژوو گرتن و حەج کردن و هەموو دروشمەکانی تر وەک قوربانی کردن بۆ خودا و نەزر لەسەر خۆپێویست کردن بۆ خودا وە قورئان خوێندن و شەونوێژ ئەمانە هەموو ڕاست و دروستن هیچ تەم و مژێکی لەسەرنییە..

## بەڵام بە دوو مەرج:

یەکەم: نابێ لەگەڵ بوونی ئەم،پەرستشێکی تر بۆ جگە لە خوای گەورە بۆ شتێکی تر ئەنجام بدرێ.

دووەم: دەبێ خاوەنەکەی بێ باوەڕ بێ بە طاغوت و دووربێ لێی.

سەبارەت بە مەرجی یەکەم کە بریتیە لەوەی هیچ پەرستنێک بۆ هیچ شتێکی تر جگە لە خودا ئەنجام نەدات، نموونەی زۆرە لەوانە:
کەسێ بچێتە سەر گۆڕی پێغەمبەران یان پیاوچاکان و داوایان لێ بکات پێداویستیەکانی بۆ جێبەجێ بکەن، لێرەدا جۆرێک لە جۆرەکانی پەرستنی بۆ شتێک جگە لە خودا ئەنجام داوە،بەمەش هاوبەشی بۆ خودا داناوە،لەپاش ئەمەشدا هیچ شتێک لە نوێژ و ڕۆژوو سودی پێ ناگەیەنێ،سوود لە هیچ شتێکی تر لە پەرستنەکانی وەرناگیرێ، چونکە کەوتە ناو هاوبەش پەیداکردنە گەورەکە کە بەهۆیەوە لە ئیسلام چۆتەدەرێ.

نموونەیەکی تر ئەوەیە کە یاسایەک دەربکات یان ڕەزامەندی لەسەر دەربکات پێی ڕازی بێ یان بەرگری لێ بکات،بەمەرجێ ئەم یاسایە دژبێ بەوەی هاتووە لە قورئان و فەرمووده وەکو یاسای قەدەغەکردنی فرەژنی یان یاسای گەشتی ئافرەت بەتەنها و بێ سەرپەرشتیار بۆ دەرەوەی وڵات یان یاسای قەدەغەکردنی باڵاپۆشی و سەرپێچەوە وە هەروەها هی تریش، جا هەرکەسێ ئەنجامی بدات یان یان گوێڕایەڵی

بێ و جێبەجێی بکات بەسەرخەڵکی مسوڵماندا بێگومان ئەوە هاوبەشی بۆ خودا پەیداکردووە لە یاسادانان، خوای گەورەش دەفەرموێ: (مْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ) الشوری٢١.

واتە: ئایا ئەم بێ باوەڕانە بە شەرعی خوای گەورە ڕازی نین)یاخود شوێنی ئەو هەڵگەڕاوانە دەکەون کە بەناوی دینەوە بەرنامەیان بۆ دادەڕێژن و پەیڕەویان لێ دەکەن،بێ ئەوەی خوای گەورە ڕوخسەتی پێدابن و پێی ڕازی بێت.

هەروەها دەفەرمووێ: (فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا) النساء٦٥.

واتە: سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی (لافی بڕوا لێدەدەن)بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدا تۆنەکەن بە دادوەر و گوێڕایەڵی تۆنەکەن لەنێوان، دواى ئەوەش نابێ  لە دڵ و دەرونیاندا هیچ نارەزاییەک دروست ببێت بەرامبەر ئەوەی کە دادوەیت لەسەری کردووە دەبێت بەتەواوی تەسلیم بن و ڕازی بن.

(أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَىٰ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا) النساء ٦٠_٦١.

واتە: ئایا نەتڕوانیوەتە ئەو دووڕووانەی لاقی ئەوە لێدەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی کە بۆ تۆ ڕەوانەکراوە و بەوەش پێش تۆ ڕەوانەکراوە(بۆ دەیانەوێت ڕووبکەنە زۆردار و جادووگەر و خوانەناسان تا دادوەریان لەنێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن لەکاتێکدا بەڕاستی فرمانیان پێکراوە کە باوەڕیان بە (طاغوت) نەبێت، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور و بێ سنوور، کاتێکیش پێیان بوترێ وەرن بۆلای ئەو قورئانە کەخوا ناردویەتیە خوارەوە بۆلای پێغەمبەر (بۆ چارەسەری کێشەکانتان) کەچی دەبینی دووڕووەکان پشتت تێدەکەن و رووت لێ وەردەگێڕن بەتەواوی.

کەوابوو لێرەدا بەبەڵگەی یەکلاکەرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە وەرگرتنی یاسا لەکەسێک جگە لە خودا و ڕازی بوون پێی پەرستنە وەکو کوڕنوش و سوژدە و نوێژکردن بۆکەسێک جگە لە خودا پێشەوا(احمد و ترمذي و ڕاقەکەران فەرمودەیان هێناوە بە لە(عدي کوڕی حاتم الطائی)

که گاور بوو پاشان مسوڵمان بوو،ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە:

(اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ)التوبه٣١.

واتە: (گاور و جولەکەکان)حاخام ق قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لەجیاتی خوای تعالی.

جاعدی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆ نەیان پەرەستون

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی: ئایا حەرامیان بۆ حەڵاڵ نەدەکردن و حەڵاڵیان لەسەر حەرام نەدەکردن،ئەوانیش گوێڕایەڵیان نەدەکردن، ووتی بەڵێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئا ئەمەیە پەرەستنیان بۆیان.

جالەم فەرموودەیە دەردەکەوێ کەگوێڕایەڵی بۆهەرکەسێک لەدانانی یاساو ڕێسا ڕێژی هەروەها جێبەجێکردنی فەرمانەکانی دەبێتە

پەرەستن بۆ ئەوکەسە،کەئەمەش بەهاوبەش پەیداکردنی گەورە دادەنرێت کەخاوەنەکەی پێ لەئیسلام دەردەچێ.
شێخ محمد عبدالوهاب دەفەرمووێ: (هەرکەسێک گویڕایەڵی زانایان وفەرمان ڕەواکان بکات لەحەرام کردنی شتێک کەخوا حەڵاڵی کردبێ هەروەها لەحەڵاڵکردنی شتێک کەخواحەرامی کردبێت ئەوا ئەوانی کردوە بەخودا بێجگە لەخودا)
پەرتوکی (التوحيد الذي هو الحق الله على العبيد)

وە ڕەنگە (زانا) بەکرێ گیراوەکانیش لەوتارەکانیان یان لە پەرتوکەکانیان وەیان لەسەر شاشەی کەناڵە عەلمانیەکان بڵێن: یاسا و ڕێسا دانان بابەتێکە هیچ پەیوەندی نیە بەبیروباوەڕو یەکخوا پەرەستی، بەڵام ڕاستی ئەوەیە کەئەم وشەو زاراوانە بزوتنەوە ئیسلامیە نوێیەکان هێناویانە، بەوپێیەش ئەمانە کەهەمیشە ڕاستیەکان دەگۆڕن وشارەزاوپسپۆریشن لەبەرگری کردن لە طاغوتەکان وستەم وتاوانەکانیان،دڵێن گومان دەخەنە بیری خەڵک تاوەکو هەروا بەبەنج کراوی بمێننەوە بەرەوڕوی ستەم کاران

هەڵنەستن،وەبۆ وەڵامدانەوەیان وئاشکراکردنی پوچی گومانەکانیان لێرەدا ئەوە دەهێنینەوە کەلەتەفسیری(ابن کثیر)داهاتوە کەلەسەدەی هەشتەمی کۆچیدا ئەم تەفسیرەی نوسیوە لەسەردەمێک کە نەپارتی ئیسلامی و نەبزوتنەوەی ئیسلامی هەبوەو نەشتێکیش هەبو لەوەی باس دەکرێ لەلایەن ئەوانەی ئێستا خۆیان خستۆتە بەرەوپشتیوانی کردنی نارەوا لەدژی موسڵمانان وستەم وزۆرداری وهەڵگەڕانەوەی ستەم کار پەردەپۆش دەکەن، ئەم تەفسیرەی(ابن کثیر)یش کەسێکە لە ناوداران وپێویست بەپێناس کردنی ناکات.

لە تەفسیری ئیبن کثیردا لەڕاڤەی ئەم ئایەتەی خوارەوەدا هاتوە کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ سورة الأنعام ١٢١

(٢٩٦٦) ابوداود فەرمویەتی کەلە(ئیبن عباس) گێڕاوەتەوە لە ئایەتی (وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ) دەیانووت: ئەوەی خودا کوشتویەتی مەیخۆن،ئەوەش کەئێوە سەری دەبڕن بیخۆن، جاخودای گەورە ئەمەی دابەزاند:

(وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ) حديث حسن اخرجه ابوداود (٢٨١٨) وإسناد الحديث صحيح على شرط مسلم.(كما جاء في حاشية تفسير ابن كثير بتحقيق عبدالرزاق المهدي).

وە سەعدی لەڕاقەی ئەم ئایەتە فەرمویەتی: بێ باوەڕان بە موسڵمانەکانیان دەوت چۆن بانگەشەی ئەوە دەکەن کەبەدوای ڕەزامەندی خودا دەچن کەچی ئەوەی خودا دەیکوژێ نایخۆن، وە ئەوەی خۆتان سەری دەبڕن دەیخۆن جا خودای گەورە فەرمووی:

(وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ) ئەگەر گوێڕایەڵیان بکەن لەخواردنی مرداربووەوە، (إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ) ئەوائێوەش لەهاوبەش پەیداکەرانن،هەربەم شێوەیەش (مجاهدوظحاك و) چەندانی تر لەزانایانی پێشینەچاکەکان فەرمویانە ڕەحمەتی خوایان لێبێت.

وە فەرمایشتی خودای گەورە: (وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ)واتە کاتێک کەلەفەرمان و بڕیاری خودا لادەن بۆوتەی کەسێکی تر و هەڵتانبژارد بەسەر وتەی خودا ئەمە خودی هاوبەش پەیداکردنە، هەروەک خودای گەورە دەفەرموێ:

(اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ )سورة التوبة٣١
واتە: (گاورو جولەکەکان)خام وقەشەکانی خۆیان کردوەتە پەروەردگاری خۆیان لەجیاتی خوا.

(٢٩٦٧)وە ترمزی لەتەفسیرەکەی گێڕاویەتیەوە لەعەدی کوڕی حاتم کەوا فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خۆنەیان پەرەستون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵکو کاتێک کەحەرامیان بۆحەڵاڵ کردون حەڵاڵیان لێ حەرام کردون،کەئەمانیش لەمەدا گوێڕایەڵیان کردن ئەمە پەرەستنیانە بۆیان.
(حسنه بمجموع طرقه الالباني في سلسلة الصحيحة ٣٢٩٣)

جاهەر کەسێک گوێڕایەڵی بڕیارێک بکات لەبڕیارەکانی ئەو یاساو ڕێسایانەی مرۆڤ دایناوە وازیش لەبڕیاری خوداو پێغەمبەرەکەی بهێنێ لەهەمان بابەت وکێشەدا ئەوا هاوبەشی بۆخودا پەیداکردوە جگە لەخودا شتێکی تری کردوە بەپەروەردگاری.

بۆیە پێویستە موسڵمان بزانێ کەئەوهاوبەش پەیداکردنەی ڕودەدات لە کاتی کڕنوش بردن بۆ بتێک یاخود نوێژکردن بۆپەیکەرێک ئەوا هەمان هاوبەش پەیداکردنەکە ڕوودەدات لەکاتی جگە لەخودا کەسێکی تر بکەی بەبڕیاردەرو یاساو ڕێژ بەدەستەواژەیەکی تر: هەر کەسێک ڕازی نەبێ بەیاساکانی ئاینی ئیسلام یاخود ڕەتی بکاتەوەو ڕازی بێت بەیاساوبڕیارێکی تر جگە لەئاینی ئیسلام، یان یاساوبڕیارێکی تربەچاکتربزانێ لەیاساو بڕیارەکانی ئیسلام یاخود بڵێ: یاساکانی ئیسلام تایبەت بون بەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ و صەحابەکانی،یان پشت بکات ولابدات لەهەر بڕیارێک لەبڕیارەکانی ئاینی ئیسلام وەڕازی بێت کەبچێت بۆژێر بڕیارێکی تر، بەهەر شێوازێک بێ وبەهەرناوێک بێت، ئەوا ئەوکەسە بوەتە هاوبەش پەیداکەر بۆ خودا بەهاوبەش پەیداکردنی گەورەی دەرخەر لەئاین.

باپرسیاریش بکەین لەوەی ڕوودەدات لەپەرلەمانی هەروڵاتێک کاتێک بابەت وکێشەیەک دەخرێتە ڕوو ودەنگی لەسەر دەدرێ، ئایا زۆرینەی دەنگەکان بڕیارنادات ئەگەرچی پێچەوانەی یاساکانی ئاینی ئیسلامیش بێت!؟

یاخود ئەوەیە کەپەرلەمان هەر لەسەرەتادا هەموئەویاساو ڕێسایانە و بەرنامانە ڕەت دەکاتەوە کەپێچەوانەن لەگەڵ وتەو فەرمان و بڕیارەکانی خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ!

بۆ نموونە ئەگەر هاتو بابەتێک خرایەڕوو لەسەر ڕێگەدان بەفرۆشتن و خواردنەوەی مەی ئینجا زۆرینەی ئەندام پەرلەمانەکان ڕەزامەندنیان لەسەردا، ئایا ڕاو حوکم لەسەر ئەم ئەنجومەنەو ئەم پەرلەمانە چ دەبێ؟ئایا چ حوکمێک دەدرێ بەسەر ئەم ئەندامانەی ڕازی بونە لەسەر ئەمە؟

بێ هیچ گومانێک ئەوکاتە ئەم ئەنجومەنە ئەنجومەنێکی هاوبەش پەیداکەرە ئەندامەکانی کەڕەزامەندیان داوە لەسەری هاوبەش پەیداکارن بۆخودا بەهاوبەش پەیداکردنێکی گەورە هەڵگەڕاون لە ئیسلام باموسڵمانیش بن.

جا چ شتێک مەترسیەکەی گەورەترە لەمەترسی هاوبەش پەیداکردن بۆ خودای گەورە، لە کاتێکدا خودا دەفەرموویت: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا)سورة النساء ٤٨

واتە: بەڕاستی خودا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیاربدرێت، بێجگە لەوە لەهەر گوناحێکی تر بیەوێ خۆش دەبێت، جائەوەی هاوەڵ و شەریک بۆخودا بڕیار بدات ،ئەوەئیتر بەڕاستی تاوانێکی گەورەی هەڵبەستوە ئایاکێ ڕازیە هاوبەش بۆخودا دابنێت تالەسە ئەمە دوا ڕۆژی خۆی بۆهەتا هەتایی بدۆڕێنێ وخۆی بخاتە ڕیزی ئەوانەی لەناو ئاگری دۆزەخدا بەنەمری دەمێننەوە بەهەتاهەتایی؟بۆکێ ئەمە دەکات؟ بۆچی؟؟

(أَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ)؟سورة يوسف٣٩

واتە: ئایا چەند خوایەکی هەمەجۆر وجیاواز (بپەرەسترێن) چاکترن، یاخود خودایەکی تاک وتەنهاوزاڵ بەسەرهەمو شتێکدا؟

(أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ)سورة المائدة٥٠

واتە: ئایائەوانە حوکم وفەرمانڕەوای جاهیلیت ونەفامیان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە کێ هەیە بەقەدەر خودا حوکمی جوان وچاک و بەجێ بێنێت؟بەتایبەت لای ئەوکەسانەی کەبەوردی سەرنج دەدەن وویژدان وهەستی زیندویان هەیە.(پوختەی قورئان)

ئیبن کثیر لەتەفسیرەکەیدا بۆئەم ئایەتەی سورەی مائدە دەفەرمووێت: خوای گەورە سەرکۆنەی ئەوکەسەدەکات کە لەحوکمی خوا دەرچوە کە حوکمێکی ساغ و تۆکمەیە وگشتگیرە بۆ هەمووشتێکی باش و ڕێگرە لە هەمو خراپەیەک،پاشان لار بکاتەوەو بچێتە ژێر جۆرەها شتی تر لەو ڕاو ئارەزوپەرەستی وزاراوانەی کەمرۆڤ دایناون، کە ئەویش (ئەو یاسایانەیەکەفەرمان ڕەوایەتی پێدەکرێ لەم ڕۆژگارەدا لە هەموو وڵاتانی موسڵمانان لەجێگای یاساوبەرنامەی خودای گەورە،ئەوەش لە دوای دەست بەسەرداگرتنی دەسەڵات لەلایەن گروپە عەلمانیەداخ لە دڵەکان بەرامبەر ئاین و ئاینخوازی کەئەوەش ئەونەفامیەتیە کەخوای گەورە لەم ئایەتە بەناوی هێناوە)

بێ پاڵپشتێک لەشەریعەتی خودای گەورە، هەروەکو پێشتر خەڵکانی نەفام و حوکمیان دەکرد بەگومڕای و نەفامیەتەی بەئارەزوی خۆیان دایان دەڕشت، وە هەروەکو (تەتارەکان)فەرمانڕەوایەتیان دەکرد بەو سیاسەتە شاهانەی وەریان گرتبوو لە(جەنگیزخان)ی پادشایان، کە دەستورێکی بۆ دانابون بەناوی(یەساق)

کە ئەویش بریتی بو لە پەرتوکێک،کۆمەڵە یاساو ڕێسایەکی تێدا کۆکرابووەوە لەچەندین بەرنامەو ئاینی جۆراوجۆر وەری گرتبو.

وەك: ئایینی(جولەکەو گاورو ئاینی ئیسلام)، وە زۆرێک یاسا و ڕێساشی تێدا بوو کەزادەی بیروئارەزوی خۆی بو، ئەمە لەناو کوڕەکان ونەوەکانیدا ببوە یاساو ڕێبازێکی کارپێکراو،کەلەلایان لە پێشتر بوو لەکارکردن بەقورئان وفەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ جاهەر یەکێک لەوان ئەوکارەی بکردایە ئەوا بێگومان بێ باوەڕ بوو پێویست بوو جەنگ لەدژی بکرێت، تا دەگەڕایەوە ژێر یاساو بڕیارەکانی خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ وە جگە لەمە نابێت بچێتە ژێرباری هیچ بەرنامەیەکی تر نە بەکەم و نەبەزۆر، خوای گەورە دەفەرموویێت: (أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ) واتە: دەیانەوێت ولایان پەسەندە وە لە یاساو

بڕیاری خودای گەورە لادەدەن دەچنە سەر شتێکی تر؟
(وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ) واتە:کێ لە خودا دادگەرو دادپەروەرترە لەیاساوبڕیارەکانیدا بۆکەسێک لەخوداوە بەرنامەکەو ڕێبازەکەی تێبگات و باوەڕی پێی هەبێت دڵی پێوە وابەستە بێت و بزانێت کەخوای گەورە چاکترین ودادگەرترین فەرمانڕەوایە بەبەزەی ترە بۆ دروستکراوەکانی لەهەر دایکێک بۆ منداڵەکەی، چونکە خوای گەورە خۆی شارەزایە بەهەموو شتێک، دەسەڵاتدار و بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا، دادپەروەرە لە هەموو شتێکدا.

ئەی موسڵمانان: ئائە مەیە هۆی ململانێی نێوان ئێمەی خاوەن باوەڕو دەسەڵاتە عەلمانیەکان لەهەرشوێنێک بن.
ئێمە داوا لە هەمووتان دەکەین گەر باوەڕدارن کە کار بکەن بەوەی پەروەردگارتان فەرمانی پێکردون کە: (أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ) سورة النحل٣٦
واتە: تەنها خودا بپەرەستن خۆتان دورە پەرێز بگرن لەهەموو پەرستراوێکی تر.

جا وازبهێنن لەطاغوت،چ فەرمان ڕەوابێت یان دادوەر یان هەواڵگری یان خۆی لەهەر دەستەو دەزگایەکی عەلمانی ببینێتەوە لەجێگای خودا یان لەگەڵ خودا یاساوڕێسا دابڕێژرێ .

لە ڕاستیدا ئەو دوژمنایەتیەی لەنێوان ئێمە و دەسەڵاتە عەلمانیەکاندا هەیە ململانێیەکە لەنێوان باوەڕو بێ باوەڕی، ململانێیە لە نێوان ئاینی ئیسلام و ئاینی عەلمانیەت،

لە نێوان یەکخواپەرەستی وهاوبەش پەیداکردن، لە نێوان شوێنکەوتوانی پێغەمبەر ﷺ و نێوان شوێنکەوتوانی شەیطان.

بێگومان دیموکراسیەتیش یان عەلمانیەت ڕژێمێکەشت حەڵاڵ دەکات و شت حەرام دەکات، هەندێ شت و بابەتی خراپ بە چاک دادەنێ هەندێکی تریش کە چاکە بەخراپی ئەژمێرێ، وە ئاینخوازی بەنەنگی و خراپی نیشان دەدات، داوا دەکات ئاین لەدەوڵەت ودەسەڵات جیا بکرێتەوە، هەروەها داوا دەکات ئازادی بدرێ بەبێ باوەڕی و داوێن پیس و هاوبەش پەیداکردن بۆ خودای گەورە.

بەڕاستی بەری بون وباوەڕنەبون بەدیموکراسیەت وعەلمانیەت مەرجە بۆ باوەڕ وەباوەڕهەبونیش بە دیموکراسیەت و عەلمانیەت بەتاڵکەرەوەی ئاشکرایە بۆهەردو وشەی شایەتومان وە موسڵمان لە ئاینی ئیسلام دەخاتە دەرەوە.

(وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ)

سورة ال عمران ٨٥

واتە: جائەوەی بێجگە لەئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تربکات لێی وەرناگیرێت، لەقیامەتیشدا لەخەسارەت مەندو زەرەرمەندانە.

بەڕاستی گەورەترین بەڵاو نەهامەتی کە موسڵمانانی تێدەکەوێت ئەوەیە کەڕازی بێت بەوەی بچێتە ژێر باری یاساکانی (فەرەنسی یان سویدی یان ئەمریکی) وهی تر ونەچێتە ژێر فەرمان وبڕیارەکانی قورئان وفەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ!!

چۆن ڕازی دەبیێت کەلەخۆتدا دوو تێڕوانین و دوو هەڵوێستی دژ بەیەکت هەبێت بەرامبەر بەئاینی خودای تعالی، لە لایەک بۆخوا بە ڕۆژوبی ونوێژ ئەنجام بدەی بۆخواو سەردانی ماڵی خوابکەی،کەچی بە یاساو بەرنامەی ئاینی ئیسلام ڕازی نەبی، ئایا لەوکاتەی کەتۆ کڕنوش دەبەی بۆ خودای تعالی و پێت بڵێن دەبێ دەستی دز ببڕدرێ؟! چۆن دەبێ تۆ بڵێی: نەخێر ئەمە کارێکی دڕندانەیە،یاخود چۆن دەبێ بڵێی: ئەم دەست بڕینە بۆ ئەم سەردەمە ناگونجێ؟

وە یاخود ئەگەر پێت بڵێن:فرەژنی شتێکە دەقی قورئانی لەسەرهاتوە، ئایا دەکرێی بڵێی: ڕۆژئاوا بەمە ڕازی نابن!؟
بەهەمان شێوە بۆیاساکانی تری ئایینی ئیسلام
ئەمەت لەکوێ هێناوە کەوا بەنوێژ وڕۆژوو زەکات وحەج ڕازی بی و چونە ژێرباری یاساکانی ئیسلام ڕەت بکەیتەوە؟!
(أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ)سورة البقرة٨٥
واتە: ئایا بڕوادێنن بەبەشێک لەم قورئانەو هەندێکی تریشی بەدرۆ دەخەنەوە؟

(أُفٍّ لَكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ) سورة الأنبياء ٦٧

واتە: ئۆف لەدەستان لەوشتانەش کەلەجیاتی خودا دەیپەرەستن، ئایا تێناگەن!؟

ئەی موسڵمان بەڕاستی گەورەترین کارەسات کە ئەمڕۆ بەسەر موسڵماناندا هاتبێ تێکەوتنیایە لەهاوبەش پەیداکردن بۆخودا لەچونە ژێر بارو پەنابردنە بەر یاسا و بەرنامەیەک جگە لەیاساو بەرنامەی پێغەمبەرەکەی ﷺ.

بەدەستەواژەیەکی تر بەڕاستی لەئێستادا هەموو دادگاو دەسەڵاتەکان بەشێک جگە لەوەی خوای گەورە ڕەوانەی کردوە فەرمانڕەوای دەکەن، وە دادوەری دادگاکانیش بەچەندین یاسای بیانی کەمرۆڤ دایناون لە جێگای ئەوەی دادوەری بکەن بەیاساوبڕیاری خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ لە هەموو ئەوانەی پەیوەندیان هەیە بەکەس یان شەرەف وناموس یان ماڵ وسامان.

وە دەستوریش خۆی لەخۆیداو ولەلاپەڕە پێچەکانیدا کوفرو بێ باوەڕی ئاشکرا یان هاوبەش بۆخودای پەیداکردن بەئاشکرا دارڕشتوە، چونکە زۆر بەڕشتی دەقی دارڕشتوەلەسەر عەلمانیەتی وولاّت و دەسەلاّت وەلەسەر بنەڕەتی جیاکردنەوەی ئاین لەدەسەلاّت و دەلّیّ: ئیسلام یەکێکە لەسەرچاوەکانی یاسادانان نەک تەنهاو تاکە سەرچاوە!!

خودای گەورەش دەفەرمووێت: (أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ)سورة الشورى٢١

واتە: ئایا (ئەم بێباوەڕانە بەشەرعی خودای گەورە ڕازی نین)یاخود شوێنی ئەو هەڵگەڕاوانە دەکەون کەبەناوی دینەوە بەرنامەیان بۆ دادەڕێژن وەپەیڕەویان لێ دەکەن،بێ ئەوەی خوای گەورە ڕوخسەتی پێدابن وپێی ڕازی بێت.

ئەی موسڵمانان: بۆچی قورئان دەخوێنی و لەخواترسانیش نیشان دەدەی لەخوێندنەوەدا؟

بۆچی پەرۆشی بۆ تەواوخوێندنەوەی قورئان وخەتم کردنی لەمانگی ڕەمەزانی پیرۆز؟

بەڵکو زۆر پەرۆشتری بۆخەێندنەوری لەشەوی قەدردا!؟

خۆت وەڵامی هەمو ئەو پرسیارانە دەدەیەوەو دەڵێی: چونکە لە خوێندنەوەی قورئاندا پاداشتێکی گەورەت دەست دەکەوێت، بەڵام ئایا بۆچی باوەڕت پێی هەیە وەکو خوێندنەوە کەچی باوەڕت پێی نیە وەکو کردەوە؟

ئایا بۆچی باوەڕت وایە کەپاداشتی گەورە وەردەگری لەسەر خوێندنەوەی ئەم ئایەتانە بۆنموونە:
(الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ)سورة النور:٢
واتە: سەدقامچی لەهەریەک لەئافرەت وپیاوی زیناکار بوەشێنن، بەزەیی نەتانگرێت لەبەجێهێنانی فەرمانی خودا بۆیان،ئەگەرئێوە باوەڕتان بەخوداوبەڕۆژی دوای هێناوە،بادەستەیەکیش لەئیمان داران ئامادەی سزاکەیان بن.
بەڵام باوەڕت نیە بەجێبەجێکردنی ئەم یاساو بڕیارانە لەم ڕۆژگارانەدا، بەبیانوی ئەوەی ئەم یاساوبڕیارانە بۆئەم ڕۆژگارە ناگونجێ!!
ئایا ئەمە جێگای پێکەنین وسەرسوڕمان نیەکەتۆقورئان بخوێنیتەوەو ڕەنگە بگریت لەکاتی خوێندنەوەکەتدا، لەوەشدا دڵنیابی کە پاداشتێکی گەورەی هەیە،کەچی تۆ جێبەجێکردنی یاساو بڕیارەکانی ناو ئەم ئایەتانە ڕەت بکەیەوەو کە دەیان خوێنیەوەو پەنابەیە بەر

